# ناوەڕۆك

# پێشەکی

بەناوی خودای گەورە،ئەم پەرتووکەی لە بەردەستت دایە،پێك هاتووە لە سەد و چل وتەی کەسایەتیە ناودارەکان بە هەردوو زمانی کوردی- ئینگلیزی،من بەرهەمی لەم شێوەیەم زۆر بەدڵە،چونکە کۆمەڵێك کەسایەتی ناودار دەناسین و سوود لە وتەکانیان وەردەگرین و بۆ فێربوونی ئینگلیزیش زۆر باشە.
ئەم پەرتوکەی بەردەستت
بڵاوکراوەتەوە لە (ماڵپەڕی خەمخۆر) کە لەبەشێکی ئەم ماڵپەڕەدا فێربوونی ئینگلیزی هەیە ، وتە و پەند لقێکە لەو بەشە،کە چوار دە بابەت بڵاوکرابووە و هەر بابەتێك و دە وتە.من (هات کار) بە باشم زانی کۆی بکەمەوە لەم پەرتووکەی بەردەستت دا.

هات کار

2015-3-6

# سەرچاوەی بابەت

**ماڵپەڕ**

**http://khamkhor.com/**

**نیشانەی پێناسین**




## کۆکردنەوە و نوسینی بابەت

**خەمخۆر**

**کۆشش بێستانسووری**

## کۆکردنەوە و کردنی بەم بابەتەی بەردەستت

**هات کار**

**A girl without a mother is like a mountain with no paths**
**A girl without a father is like a mountain with no streams**

**كچ بەبێ دایك وەك چیایەكە ڕێگەی تێدا نەبێت**
**كچ بەبێ باوك وەك چیایەكە جۆگەی تێدا نەبێت**

.................................

**A hundred men can sit together quietly**
**But when two dogs get together there will be a fight**

**سەد پیاو دەتوانن بەبێ دەنگی دابنیشن پێکەوە**
**بەڵام دوو سەگ کە دەگەن بە یەك دەست دەکەن بە شەڕکردن**

..................................

**A small key opens big doors**

**کلیلێکی بچووك دەرگای گەورە دەکاتەوە**

...............................

**A thousand friends are too few, but one enemy is too many**

**هەزار هاوڕێ زۆر کەمە ، بەڵام یەك دوژمن زۆرە**

**A woman is a fortress, a man her prisoner**

**ئافرەت وەك قەڵایەكە ، پیاویش بەندكراویەتی**

**...................................**

**Beauty passes wisdom remains**

**جوانی دەڕوات بەڵام ژیری دەمێنێتەوە**

**...................................**

**Better a wise foe than a foolish friend**

**دوژمنێكی زانا باشترە لە هاوڕێیەكی نەزان**

**...................................**

**Better one day a man than ten days a woman**

**یەك ڕۆژ وەك پیاوبی باشترە لە دە ڕۆژ وەك ژن بیت**

**Do not throw the arrow which will return against you**

**تیرێك مەهاوێژە كە بگەڕێتەوە بۆ خۆت**

**.................................**

**Freedom is never given but taken**

**ئازادی هەرگیز نابەخشرێت بەڵكو دەسەندرێت**

**Fighting is better than idleness**

**شەڕكردن لە بێكاریی باشترە**

**..................................**

**Fear an ignorant man more than a lion**

**بترس لە كەسێكی گەمژە زیاتر لە شێرێك**

**..................................**

**God finds a low branch for the bird that cannot fly**

**خودا چڵەداری نزم دەدۆزێتەوە بۆ ئەو مەلەی كە ناتوانێ بفڕێت**

**..................................**

**God has created us brothers but has given us separate purses**

**خودا ئێمەی دروستكردوە وەك برا بەڵام گیرفانی جیایی پێ بەخشیوین**
**( برامان برایی ، گیرفانمان جیایی )**

**He who wants pearls has to dive into the sea**

**کێ مرواری بوێت پێویستە بڕواتە ژێر دەریا**

................................

**If God closes one door, He opens a thousand others**

**ئەگەر خودا یەك دەرگا دابخات ، ئەوا هەزار دەرگایی تر دەکاتەوە**

................................

**If skill could be gained by watching, every dog would become a butcher**

**ئەگەر فێر بوونی زانست بە تەماشاکردن بوایە ، ئەوا سەگ دەبوو بە قەساب**

................................

**If you are not a flower, don't be a thorn**

**ئەگەر گوڵ نیت ، دڕکیش مەبە**

**If you cannot build a town, build a heart**

**ئەگەر ناتوانی شارۆچکەیەك دروست بکەی ، کەواتە دڵێك دروست بکە**

**................................**

**Ignorance is sweet for the soul**

**نازانم شیرینی گیانم**

# ١٠ وتەی عەلی شەریعەتی
# Quotes by Ali Shariati



**It is hard if people don't understand your words, but harder is that if they understand you in a wrong way**

**سەختە لە قسەکانت تێنەگەن، سەختتر لەوەش ئەوەیە بە هەڵە لە قسەکانت تێبگەن**

**..........................................................**

**The one who speaks better, thinks better**

**ئەوەی کە جوانتر قسە دەکات،کەسێکە جوانتر بیر دەکاتەوە**

**.............................................**

**There is no need to accept my opinions, and it is enough to you to understand what I want to say**

**هیچ پێویست نیە تۆ لەگەڵ بۆچوونەکەی من بیت، ئەوەندە بەسە کە تۆ تێبگەی من دەمەوێ بڵێم چی**

**.............................................................**

**Trying in order to enter Paradise is better than Trying to prove that another one will enter Hell**

**هەوڵدان بۆ ئەوەی خۆت بچیتە بەهەشت باشترە بۆت لە هەوڵدان بۆ سەلماندنی ئەوەی کەسێکی تر دەچێتە دۆزەخ**

**Some people are walking in order to digest the food they ate**
**But we do it in order not to be hungry**

**هەندێک کەس بەرێگەدا دەڕۆن بۆ ئەوەی خواردنەکەیان هەرس بکەن**
**بەڵام ئێمە رادەکەین بۆ ئەوەی بە برسێتی نەمێنینەوە**

.................................................

**The Book which starts with the name of GOD and ended with the name of People is Qur'an**

**قورئان ئەو پەرتووکەیە کە بەناوی خوا دەست پێدەکات و بە ناوی خەڵك کۆتایی دێت**

.............................................

**I myself understood that**
**Live a life for the sake of Allah is harder than dying for the sake of Him**

**خۆم تێگەشتووم**
**کە ژیان لە پێناوی خودا ، قورسترە لە مردن لە پێناو خودا**

**Poverty is not going to sleep hungrily but when you spend a day without thinking**

**هەژاری شەو بە برسییەتی خەوتنی  هەژاری گوزەراندنی ڕۆژە بە بێ بیر کردنەوە**

.............................................

**Take me to the cemetery of the Dogs to be with the loyal ones for a moment**

**من لە گۆرستانی سەگەکان بنێژن بۆئەوەی ساتێك لەگەڵ دڵسۆزەکاندابم**

.............................................

**Waiting is the worst part of life, and the best part is having someone who deserves it**

**خراپترین بەشی ژیان چاوەڕوانیە ، بەڵام باشترین بەشی ژیان هەبوونی کەسێکە کەشایستەی ئەو چاوەڕوانیەبێت**

# Quotes by Bill Gates ١٠ وتەی بێڵ گێتس



**When you have money in hand, only you forget who are you .But when you do not have any money in your hand, the whole world forget who you are. It's life**

**کاتێک پارەت لەدەستایە، تەنیا تۆ لەبیری دەکەیت کە کێیت. بەڵام کاتێک کە پارەت لەدەستا نیە ئەوە تەواوی جیهان لەبیری دەکەن کە تۆ کێیت. ئەوە ژیانە**

**.......................**

**I studied every thing but never topped.... But today the toppers of the best universities are my employees**

**هەموو شتێکم خوێندووە بەڵام هەرگیز کرۆکەکەیم نەخوێندووە(نەچومەتە بنج و بناوانی)...بەلام ئەمڕۆ پلە یەکەکان (نایابەکان) ی باشترینی زانکۆکان فەرمانبەری منن**

**.....................**

**Television is NOT real life
In real life actually people have to go to work instead of sitting in a café**

**تەلەفیزۆن بریتی نیە لە ژیانی ڕاستەقینە
لە ڕاستیدا لە ژیانی ڕاستەقینەدا خەڵکی پێویستە لەسەریان کە بچن بۆ کار لەجیاتی ئەوەی دانیشن لە (چایخانە و چێشتخانەکان) قاوەخانەیەکدا**

**I failed in some subjects in exam, but my friend passed in all. Now he is an engineer in Microsoft and I am the owner of Microsoft**

**لە هەندێک بابەتدا شکستم هێناوە لە تاقیکردنەوەدا، بەلام هاوڕێکەم لە هەموویان دەرچوو. ئێستا ئەو ئەندازیارە لە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت و منیش خاوەنی کۆمپانیای مایکرۆسۆفتم**

..........................

**Don't compare yourself with anyone in this world...If you do so, you are insulting yourself**

**خۆت بە هیچ کەس بەراورد مەکە لەم جیهانەدا ... ئەگەر وا بکەیت، ئەوە نەفرەت لە خۆت دەکەیت**

............................

**If you Born Poor it's not Your Mistake, but if you Die Poor it's Your Mistake**

**ئەگەر بە هەژاری لەدایک ببیت ئەوە هەڵەی تۆ نیە، بەڵام ئەگەر بە هەژاری بمریت ئەوە هەڵەی تۆیە**

**I choose a lazy person to do a hard job , Because a lazy person will find an easy way to do it**

کەسی تەممەڵ بۆ کردنی کاری قورس هەڵدەبژێرم، چونکە
کەسی تەممەڵ ڕێگای ئاسان بۆ کردنی کاری قورس دەدۆزێتەوە

..............................

**Whether I'm at the office, at home, or on the road, I always have a stack of books I'm looking forward to reading**

ئەگەر لە نوسینگەکەم بم یان لە ماڵەوە یان لەسەر ڕێگایەکبم،
هەمیشە کۆمەڵە پەرتوکێکم پێیە بۆ ئەوەی بیانخوێنمەوە

...........................

**Your most unhappy customers are your greatest source of learning**

کڕیارە هەرە خەمبارەکانت سەرچاوەیەکی مەزنن بۆ فێربوونت

...........................

**It's fine to celebrate success but it is more important to heed the lessons of failure**

شتێکی باشە دڵخۆشبی بە سەرکەوتنەکانت بەڵام لەوە گرنگتر
ئەوەیە کە گرنگی بە شکستەکانت بدەیت و ئاگاداریان بیت

**If you love life, don't waste time, for time is what life is made up of**

**ئەگەر ژیانت خۆش دەوێت، ئەوە کات بە فیڕۆ مەدە، چونکە کات ئەو شتەیە کە ژیانی لێ دروست دەبێ**

**...............................**

**A wise man can learn more from a foolish question than a fool can learn from a wise answer**

**کەسی ژیر ئەتوانێت لە پرسیاری کەسی گێلەوە زیاتر فێر ببێت وە کەسی گێلیش ئەتوانێت وەڵامی لە کەسی ژیرەوە دەست بخات**

**............................**

**I'm not in this world to live up to your expectations and you're not in this world to live up to mine**

**نەهاتوومەتە ئەم ژیانە تا بژیم لەبەر پێشبینیەکانی تۆ وە تۆیش نەهاتوویتەتە ئەم ژیانە تا لەبەر پێشبینیەکانی من بژیت**

**............................**

**If you spend too much time thinking about a thing, you'll never get it done**

**ئەگەر کاتێکی زۆر بۆ بیرکردنەوە لە شتێک تەرخان بکەیت، ئەوە هەرگیز ئەو کارەت بۆ ئەنجام نادرێت**

**A teacher is never a giver of truth; he is a guide, a pointer to the truth that each student must find for himself**

**هەرگیز مامۆستا بەخشەری ڕاستی نیە، ئەو ڕێنیشاندەرێکە، ڕابەرێکە بەرەو ڕاستی کە هەر خوێندکارێک پێویستە لەسەری کە بۆ خۆیی بدۆزێتەوە**

..............................

**Knowledge will give you power, but character respect**

**زانست و زانیاری هێز و دەسەڵاتت پێ دەبەخشێت، بەڵام کەسایەتی[باش] ڕێزت پێ دەبەخشێت**

............................

**You just wait. I'm going to be the biggest Chinese Star in the world**

**تۆ تەنیا چاوەڕوانبە و ببینە کە من دەبم بە گەورەترین ئەستێرەی چینی لە جیهاندا**

..........................

**Do not pray for an easy life, pray for the strength to endure a difficult one**

**داوای ژیانێکی سادە و ساکار مەکە، داوای هێز بکە بۆ ئەوەی بەرگەی ژیانێکی سەخت بگریت**

**Empty your mind, be formless, shapeless — like .**
**water**
**Now you put water in a cup, it becomes the cup**
**You put water into a bottle it becomes the bottle**
**You put it in a teapot it becomes the teapot ،**
**Now water can flow or it can crash. Be water,**
**my friend**

**مێشکت بەتاڵ بکەرەوە، بێ وێنە و شێوە بە -- هەروەکو ئاو.**
**ئێستا ئاوەکە بکە ناو پەرداغێک، ئەبێت بە پەرداغەکە**
**ئاوەکە بکە ناو بتڵێکەوە، ئەبێت بە بتڵەکە**
**ئاوەکە بکە ناو قۆریەکەوە، ئەبێت بە قۆریەکە**
**ئاو دەتوانێ نەرمە شەپۆل بدات و ئەشتوانێ شتگەلێک تێک**
**بشکێنێت. ببە بە ئاو، هاوڕێم ببە بە ئاو..**

........................

**The doubters said, Man can not fly, the doers**
**said, maybe, but we'll try**
**And finally soared in the morning glow while**
**non-believers watched from below**

**گومانبەرەکان وتیان، مرۆڤ توانای فڕینی نیە، بکەرەکان وتیان،**
**بۆ نا، ڕەنگە بتوانێت، هەوڵی خۆمان دەدەین، وە لە کۆتایشدا**
**بەیانیەک بە گەشاوەیی فڕی [هەڵهات] لە کاتێکدا کە بێ بڕواکان**
**لە خوارەوە تەماشایان دەکرد**

# Quotes by Jackie Chan ١٠ وتەی جاکی چان



**If everyone does some good, think of what a good world this will be**

**ئەگەر هەموو كەسێك هەندێ باشە ئەنجام بدات، بیربكەوە لەوەی چ جیهانێكی باش دروست دەبێت**

**.........................................**

**Of course I get hurt**

**بێگومان منیش ئازارم پێ دەگات**

**......................................**

**I never wanted to be the next Bruce Lee. I just wanted to be the first Jackie Chan**

**هەرگیز نەم ویستووە ببمە بروسلی دووەم ، تەنها ویستوومە كە ببمە یەكەم جاكی چان**

**.........................................**

**Do not let circumstances control you. You change your circumstances**

**مەهێڵە بارودۆخ دەست بگرت بەسەرتدا ،بەڵكو بارودۆخی خۆت بگۆڕە**

.........................................

**When I make a film - I direct my own film**
**I write my own script - that's what I want to hear from the audience. 'Oh, thank you, Jackie**

**کاتێك فیلمێك دروست دەکەم ، خۆم دەرهێنانی ئەنجام دەدەم ،**
**خۆم ناوەڕۆکەکەی دەنووسم ،**

**ئەوە ئەوەیە کە دەمەوێ لە بینەران ببیستم کە بڵێن : ئاە جاکی سووپاس بۆتۆ**

.........................................

**Why did I become Jackie Chan Mostly because I work very hard**
**When people were sleeping, I was still training**

**بۆچی من بوومە جاکی چان بە زۆری چوونکە بە قورسی کار دەکەم ،**
**لە کاتێکدا خەڵکی خەوتوون ، من هێشتا ڕاهێنان ئەنجام دەدەم**

.........................................

**Now I am older, I understand we have to accept who we are**

**ئێستا پیر بووم ، بۆیە تێدەگەم دەبێت بەوە ڕازیبین کە ئێمە کێین**

**When I got depressed, I watched Bruce Lee movies. I learned everything from Bruce Lee**

**کاتێك تووشی پەژارە دەبووم ، تەماشای فیلمەکانی بروس لیم دەکرد ، هەموو شتێك لە بروس لی فێربووم**

........................................

**I'm not a god - I do bad things**

**من خودا نیم ، منیش شتی خراپ ئەنجام دەدەم**

........................................

**I'm tired of fighting. I've always known that I ،can't be an action star all my life**

**ماندووم لە شەڕکردن ، هەمیشە زانیومە کە ناتوانم ببمە ئەستێرەیەکی شەڕکەر لە هەموو ژیانمدا**

# ١٠ وتەی کۆنفووشیوس Quotes by Confucius



**Life is really simple, but we insist on making it complicated**

**له ڕاستیدا ژیان سادەیە ، بەڵام ئێمە سوورین لەسەر ئاڵۆز کردنی**

**.......................**

**Our greatest glory is not in never falling, but in rising every time we fall**

**مەزنترین سەربەرزیمان ئەوە نییە هەرگیز نەکەوین ، بەڵکو ئەوەیە لە هەموو کاتێکدا کە کەوتین هەستینەوە**

**.......................**

**When anger rises, think of the consequences**

**کاتێك توڕەیی دەردەکەوێت ، بیر لە سەرەنجامەکەی بکەوە**

**.......................**

**Better a diamond with a flaw than a pebble without**

**ئەڵماسێکی شکاو و درز بوو لە زیخ و بەردێکی بێ کەم و کورتی باشترە**

**When it is obvious that the goals cannot be reached, don't adjust the goals, adjust the action steps**

**کاتێك ڕوون دەبێتەوە کە ناتوانی بگەی بە ئامانجەکەت ،دەستکاری ئامانجەکەت مەکە ، بەڵکو دەستکاری هەنگاوەکانت بکە**

........................

**All good things are difficult to achieve; and bad things are very easy to get**

**هەموو شتە باشەکان بە قورسی دەست دەکەون ، بەڵام هەموو شتە خراپەکان زۆر بە ئاسانی دەست دەکەون**

........................

**Heaven means to be one with God**

**بەهەشت واتا ببیتە کەسێك کە لەگەڵ خودا بیت**

There are three methods to gaining wisdom. The first is reflection, which is the highest. The ‹second is limitation
Which is the easiest. The third is experience, which is the bitterest

سێ ڕێگە هەیە بۆ گەیشتن بە ژیری . یەکەم بیرکردنەوەیە ، کە بەرزترینیانە .
دووەم لاسایکردنەوەیە ، کە ئاسانترینیانە . سێیەم ئەزموونە ، کە تاڵترینیانە

........................

The man who asks a question is a fool for a ' minute, the man who does not ask is a fool for life

ئەو کەسەی کە پرسیارێك دەکات بۆ خولەکێك گێل و نەزانە ، بەڵام ئەو کەسەی کە پرسیار ناکات بۆ تەواوی ژیانی گێل و نەزانە

........................

It does not matter how slowly you go so long as you do not stop

ئەوە کێشە نییە کە چەند بە هێواشی دەڕۆیت بەو مەرجەی ڕانەوەستیت لە ڕۆیشتن

# Quotes by Gandhi ١٠ وتەی گاندی



**First they ignore you, then they ridicule you, then they fight you, and then you win**

**سەرەتا پشت گوێت دەخەن ، پاشان گاڵتەت پێ دەکەن ، ئینجا ڕووبەڕووت دەبنەوە ، وە دواتر تۆ دەیبەیتەوە**

..........................

**The weak can never forgive. Forgiveness is the attribute of the strong**

**لاوازەکان ناتوانن خەڵکی ببەخشن ، بەخشین تایبەتمەندی بەهێزەکانە**

..........................

**Nobody can hurt me without my permission**

**هیچ کەسێك ناتوانێ ئازارم بدات بەبێ ڕێ پێدانی خۆم**

..........................

**I will not let anyone walk through my mind with their dirty feet**

**ڕێگە بە هیچ کەسێك نادەم بە پێیە پیسەکانی لەناو مێشکمدا ڕێ بکات**

**Your beliefs become your thoughts**
**Your thoughts become your words**
**Your words become your actions**
**Your actions become your habits**
**Your habits become your values**
**Your values become your destiny**

**باوەڕت دەبێت بە بیرکردنەوەکانت**
**بیرکردنەوەکانت دەبێت بە وشەکانت**
**وشەکانت دەبێت بە کردارەکانت**
**کردارەکانت دەبێت بە نەریت و خووت**
**نەریت و خووت دەبێت بە نرخت**
**وە نرخیشت دەبێت بە چارەنووست**

**........................**

**The future depends on what you do today**

**داهاتووت بەندە لەسەر ئەوەی کە ئیمڕۆ چی دەکەی**

**........................**

**You don't know who is important to you until you actually lose them**

**نازانیت کە کێ گرنگە بۆت تا لە ڕاستیدا لە دەستیان دەدەیت**

**You can chain me, you can torture me, you can even destroy this body, but you will never imprison my mind**

**دەتوانی زنجیرم بکەیت ، دەتوانی ئازارم بدەیت ، تەنانەت دەتوانی ئەم لاشەیش وێران بکەیت ، بەڵام هەرگیز ناتوانی مێشکم زیندانی بکەیت**

**..........................**

**Where there is love there is life**

**خۆشەویستی لە کوێدا بێت ژیانیش لەوێیە**

**..........................**

**You must not lose faith in humanity. Humanity is an ocean; if a few drops of the ocean are dirty, the ocean does not become dirty**

**پێویستە باوەڕت بە مرۆڤایەتی لە دەست نەدەیت . مرۆڤایەتی زەریایەکە ، ئەگەر دڵۆپێکی کەمی زەریاکە پیس بێت ، زەریاکە پیس نابێت**

# ١٠ وتەی مەولانای ڕۆمی Quotes by Rumi



**I smile like a flower not only with my lips but with my whole being**

**وەکو گوڵێک زەردەخەنە دەکەم، نەک تەنیا بە لێوەکانم بەڵکو بە تەواوی بوونمەوە**

....................

**A candle loses none of its light by lighting another**

**مۆم بە ڕوناککردنەوەی مۆمێکی تر هیچ لە ڕوناکیەکەی لەدەست نادات**

....................

**Where the lips are silent the heart has a thousand tongues**

**لەو شوێنەی کە لێوەکان بێدەنگن، دڵ هەزار زمانی هەیە**

...................

**Be like a tree and let the dead leaves drop**

**چەشنی دار بە و بهێڵە گەڵا مردووەکان هەڵوەرن**

**Yesterday I was clever, so I wanted to change the world. Today I am wise, so I am changing myself**

**دوێنێ زیرەك بووم، هەربۆیە دەمەویست جیهان بگۆڕم.**
**ئەمڕۆکە ژیرم، هەربۆیە گۆڕان لە خۆما بەرپا دەکەم**

..................

**The angel is free because of his knowledge, the beast because of his ignorance. Between the two remains the son of man to struggle**

**فریشتە ئازادە بەهۆی زانست و زانیاریەکەیەوە، ئاژەڵیش بەهۆی بێ مێشکیی و نەزانیەکەیەوە. لەو نێوەندەدا مرۆڤ ماوەتەوە کە دەبێت هەوڵ بدات و تێبکۆشێت**

..................

**When you feel a peaceful joy, that's when you are near truth**

**ئەو دەمەی هەست بە ئاشتی و ئارامی ئەکەی، ئەو دەمەیە کە لە ڕاستی نزیکی**

..................

**Love is the bridge between you and everything**

**خۆشەویستی پردێکە لەنیوان تۆ و هەموو شتێکدا**

**As you start to walk out on the way, the way appears**

**که دەستت بە ڕۆشتن کرد لەسەر ڕێگەکە، ئەوجا ڕێگەکە دەردەکەوێ**

**....................**

**Goodbyes are only for those who love with their eyes. Because for those who love with heart and soul there is no such thing as separation**

**ماڵئاوایی تەنها بۆ ئەو کەسانەیە کە بە چاو یەکتریان خۆش دەوێت، چونکە ئەوانەی کە بە دڵ و بە گیان یەکتریان خۆش دەوێت شتێک بە ناوی جیابوونەوە نیە لەلایان**

# Quotes by Zig Ziglar ١٠ وتەی زیگ زیگلار



**You don't have to be great to start, but you have to start to be great**

**پێویست ناكات مەزن بیت هەتا دەست پێ بكەیت ، بەڵكو پێویستە دەست پێ بكەیت هەتا مەزن بیت**

.....................................

**There is no elevator to success…you have to take the stairs**

**هیچ بەرزكەرەوەیەك نییە بۆ سەركەوتن ، پێویستە خۆت بە پلەكاندا سەربكەویت**

...................................

**Where you start is not as important as where you finish**

**لە كوێ دەست پێ دەكەیت هێندەیی ئەوە گرنگ نییە لە كوێ كۆتایی پێ دێنیت**

...................................

**If you don't see yourself as a winner, then you cannot perform as a winner**

**ئەگەر خۆت وەك براوە نەبینیت ، كەواتە ناتوانی براوە بیت**

**You are the only person on earth who can use your ability. It's an awesome responsibility**

**تۆ تاكە كەسی لەسەر زەوی كە بتوانی توانایی خۆت بەكار بهێنیت ، ئەمەیش بەرپرسیاریەتیەكی بێوێنەیە**

..........................................

**Duty makes us do things well, but love makes us do them beautifully**

**ئەرك وامان لێدەكات شتەكان بە باشی ئەنجام بدەین ، بەڵام خۆشەویستی وامان لێدەكات شتەكان جوان بكەین**

..........................................

**If you can dream it, you can achieve it**

**ئەگەر بتوانی خەونی پێوە ببینیت ، ئەوا دەشتوانی بیهێنیتە دی**

..........................................

**You can't climb the ladder of success dressed in the costume of failure**

**تۆ ناتوانی بەسەر پەیژەیی سەركەوتندا سەركەویت، لە كاتێكدا جل و بەرگی سەرنەكەوتنت پۆشیوە**

**If you go out looking for friends, you will find they are very scarce**
**If you go out to be a friend, you will find them everywhere**

**ئەگەر بڕۆیتە دەرەوە بۆ دۆزینەوەی هاوڕێ ، ئەوا دۆزینەوەیان زۆر دەگمەنە**
**ئەگەر بڕۆیتە دەرەوە تا هاوڕێ دروست بکەیت ، ئەوا دەیان بینیت لە هەموو شوێنێکدا**

..................................

**I am an expert in Higher Level Math**
**You + God= Enough**

**من کەسێکی شارەزام لە ئاستێکی بەرزی بیرکاریدا**
**تۆ +خودا = تەواو هەموو شتێکە**

# Quotes by Jim Rohn ١٠ وتەی جیم رۆهن



**Take care of your body. Its the only place you have to live**

**ئاگات لە لاشە و لەوارت بێت. چونکە تاکە شوێنە کە دەبێ تیایدا بژیت**

........................

**Don't wish it were easier. Wish you were better**

**خۆزگە مەخوازە بۆ ئەوەی کە ئاسانتر بوایە، خۆزگە بخوازە کە باشتر بوایەیت**

......................

**Find someone who is willing to share the truth with you**

**کەسێک بدۆزەرەوە کە ئاواتەخوازی ئەوەبێ هاوبەشی ڕاستیت لەگەڵ بکات**

.....................

**Average people look for ways of getting away with it; successful people look for ways of getting on with it**

**تێکڕای خەڵک دەگەڕێن بەدوای ڕێگای هەڵهاتن لێی؛ بەڵام کەسە سەرکەوتووەکان دەگەڕێن بەدوای ڕێگای سەرکەوتن بەسەریدا**

**Poor people have big TVs. Rich people have big libraries**

**هەژارەکان تەلەفزیۆنی گەورەیان هەیە. دەوڵەمەندەکان پەرتووکخانەی گەورەیان هەیە**

**....................**

**Miss a meal if you have to, but dont miss a book**

**ژەمێک لەدەست بدە ئەگەر پێویستی کرد، بەڵام هەرگیز پەرتوکێک لەدەست خۆت مەدە**

**....................**

**I will take care of me for you, if you will take care of you for me**

**ئاگام لە خۆم دەبێت لەبەر تۆ، ئەگەر تۆش ئاگات لە خۆت بێت لەبەر من**

**....................**

**How sad to see a father with money and no joy the man studied economics, but never studied happiness**

**چەندە جێگەی دڵتەنگیە کە باوکێک بە پارەیەکی بێ دڵخۆشیەوە ببینی. مرۆڤ هونەری ئابووری دەخوێنێ بەڵام هەرگیز هونەری خۆشبەختی ناخوێنێ**

**Happiness is not an accident. Nor is it something you wish for. Happiness is something you design**

**خۆشبەختی نە ڕووداوێکە، وە نە شتێکە کە خۆزگەی بۆ بخوازی، بەڵکو خۆشبەختی شتێکە کە خۆت دەینەخشێنی**

**........................**

**Dont wish for less problems; wish for more skills**

**ئاوات مەخوازە کە کێشەکانت کەم بن بەڵکو ئاواتی ئەزمونی زیاتر بخوازە**

# ١٠ وتەی واڵت دسنی Quotes by Walt Disney



**The way to get started is to quit talking and begin doing**

**ڕێگای دەستپێك بریتیە لە وازهێنان لە قسە کردن و دەست کردن بە کردار**

..............................................

**When you're curious, you find lots of interesting things to do**

**کاتێك تۆ زانستخواز بیت ، ئەوا شتگەلێکی زۆر دەدۆزیتەوە کە بە ئەنجامیان بگەیەنیت**

..............................................

**A man should never neglect his family for business**

**پیاو نابێ هەرگیز لەبەر کارەکەی خێزانەکەی پشتگوێ بخات**

**I'd say it's been my biggest problem all my life... it's money. It takes a lot of money to make these dreams come true**

**دەمەوێ بڵێم گەورەترین کێشەی ژیانم کە هەمبووە ... پارە بووە.**
**چونکە پارەیەکی زۆری دەوێ تا خەونەکانم ببن بە ڕاستی**

**............................................**

**You reach a point where you don't work for money**

**گەر بۆ پارە کار نەکەیت ئەوە بە ئامانجەکەت دەگەیت**

**..................................**

**I do not like to repeat successes; I like to go on to other things**

**دووبارەکردنەوەی سەرکەوتنەکانم پێ خۆش نیە ، بەڵکو**
**حەزدەکەم لە شتی تردا سەرکەوتووبم**

**Why worry? If you've done the very best you can, worrying won't make it any better**

**بۆ نیگەرانی''دودڵی''؟ ئەگەر تەواوی هەوڵی خۆتت دابێ، ئەوە نیگەرانی''دودڵی'' هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێ**

.....................................

**In bad times and in good, I have never lost my sense of zest for life**

**لە کاتانی خراپ و چاکیشدا ، هەرگیز هەستی چێژ وەرگرتنم لە ژیان ون نەکردووە**

.........................................

**The difference in winning and losing is most often not quitting**

**زۆربەی کات جیاوازی نێوان بردنەوە و دۆڕاندن بریتییە لە وازنەهێنان**

.........................................

**It's a mistake not to give people a chance to learn to depend on themselves while they are young**

**ئەمە هەڵەیە کە دەرفەت بە کەسانی تر نەبەخشیت تا فێربن و پشت بەخۆیان ببەستن لە کاتێکدا گەنجن**

**If you’re not making someone else’s life better, than you are wasting your time**
**Your life will become better by making other people’s lives better**

**کاتی خۆت بەفیڕۆ دەدەیت، ئەگەر ژیانی کەسێکی تر باشتر نەکەیت**
**ژیانت بە باشکردنی ژیان و گوزەرانی کەسانی تر باشتر دەبێت**

........................

**Don’t ever let someone tell you that you can’t do something**
**You got a dream, you got to protect it. When people can’t do something themselves, they are going to tell you that you can’t do it. You want something, go get it. Period**

**هەرگیز ڕێگە بە کەس مەدە کە پێت بڵێت تۆ ناتوانیت شتێک ئەنجام بدەیت. تۆ خەونێکت هەیە، وە دەبێت بیپارێزیت. کاتێک کە خەڵکی ناتوانن خۆیان شتێک ئەنجام بدەن، بە تۆ دەڵێن کە ناتوانی ئەوە بکەیت**
**ئەگەر شتێک دەخوازیت، بڕۆ و بەدەستی بێنە**

**There are so many people who have lived and died before you**
**You will never have a new problem; you’re not going to ever have a new problem. Somebody wrote the answer down in a book somewhere**

**زۆر کەس هەن کە پێش تۆ ژیاون و مردوون. هەرگیز کێشەیەکی نوێت نایەتە پێش؛ ناکەویتە ناو کێشەی نوێوە.**
**چونکە کەسێک وەڵامەکەی لە پەرتوکێکدا نوسیوە لە جێگایەک**

.......................

**Don’t chase people. Be yourself, do your own thing and work hard**
**The right people – the ones who really belong in your life – will come to you. And stay**

**دوای خەڵکی مەکەوە. خۆتبە، کاری خۆت بکە بە ئەوپەڕی تواناتەوە. خەڵکانی ڕاست و ڕەوان -**
**ئەوانەی کە بەڕاستی موڵکی تۆن لە ژیاندا - ئەوە دێنەوە لات و لەلات دەمێننەوە**

.......................

**Never underestimate the pain of a person because in all honesty, everyone is struggling**
**Some people are better at hiding it than others**

**هەرگیز بە سوکەوە لە ئازاری کەسێک مەڕوانە، چونکە بە ڕاستی هەموو کەس هەوڵ دەدات**
**بەڵام هەندێکیان لە شاردنەوەدا [شاردنەوەی ئازاردا] لەوانی تر باشترن**

**Stop letting people who do so little for you control so much of your mind, feelings and emotions**

**مەهێڵە ئەو کەسانەی کە شتگەلێکی سادە و کەمت پێشکەش دەکەن هزر و هەست و سۆزت داگیر بکەن و دەستی بەسەردا بگرن**

........................

**We spend money that we do not have**
**On things we do not need**
**To impress people who do not care**

**پارە خەرج دەکەین کە نابێ خەرجیکەین**
**لە شتانێکا کە پێویستمان نیە**
**بۆ ئەوەی کار لە خەڵکانێک بکەین [بە پارەکە] کە گرنگ نین و گرنگیمان پێ نادەن**

........................

**Money and success don’t change people; they merely amplify what is already there**

**پارە و سەرکەوتن ژیانی خەڵک ناگۆڕن؛ بەڵکو ئەوان تەنیا گەشە بەو شتانە دەکەن**
**[ئەو شتانە گەورە دەکەن] کە پێشتر ئامادەکراون**

**The first step is you have to say that you can**

**هەنگاوی یەکەم بریتیە لەوەی کە دەبێ بڵێی کە دەتوانیت**

..........................

**Throughout life people will make you mad**
**disrespect you and treat you bad**
**Let God deal with the things they do, because**
**hate in your heart will consume you too**

**لە ژیاندا خەڵکانێک هەن کە شێتت دەکەن، بێ ڕێزیت بەرامبەر**
**دەکەن و بە خراپیش مامەڵەت لەگەڵ دەکەن. هەمووی بدە**
**دەستی خودا ئەوانەی ئەوان دەیکەن،**
**چونکە ڕق و کینەی نێو دڵت تۆش لەکار دەخات**

**By increasing the good deeds we do, we will automatically have less time for bad deeds**

**بە زۆرکردنی ئەو کردەوە چاکانەی کە ئەنجامیان دەدەین**
**خۆکارانە کاتێکی کەممان دەبێت بۆ کردنی کردەوەی خراپ**

**............................**

**Hard words can not touch a soft heart but soft words can touch a hard heart, so choose carefully how you decide to speak to others**

**وشەی ڕەق کاریگەری نابێت لەسەر دڵێکی نەرم ، بەڵام وشەی**
**نەرم کاریگەری دەبێت لەسەر دڵێکی ڕەق ، کەواتە**
**بە وریایی بڕیار بدە چۆن لەگەڵ کەسانی تر قسە دەکەیت**

**............................**

**When our hearts are filled with malice, hatred Selfishness & jealousy the space for love kindness, tolerance & selflessness diminishes**

**کاتێك دڵەکانمان پڕ بێت لە ڕق و قین و خۆپەرستی و بەخیلی ، ئیتر**
**بۆشایی بۆ خۆشەویستی و بەخشندەیی و لێخۆشبوون و خۆنەپەرستی نامێنێتەوە**

**Dont expect everyone to think that you are a good person even if you are**
**And dont let that make you lose your good nature**

**چاوەڕێی هەموو کەس مەکە کە بە کەسێکی باش بیرت لێبکەنەوە تەنانەت گەر باشیش بیت**
**وە مەهێڵە ئەمە وات لێ بکات کە سروشتی چاکی خۆت لە دەست بدەیت**

..............................

**Life is full of tests and challenges. If you dont want them you havent understood life**

**ژیان پڕە لە تاقیکردنەوە و ڕووبەڕوو بونەوە ، ئەگەر ئەوانەت نەوێت کەواتە تۆ لە ژیان تێنەگەیشتوویت**

**Those who lie will easily believe a lie and find it difficult to accept the truth**
**Whereas those who are truthful will easily recognize the truth and find it difficult to believe a lie**

**ئەو کەسانەی کە درۆزنن بە ئاسانی باوەڕ بە درۆ دەکەن و ڕاستیش بە قورسی وەردەگرن**
**کەچی ئەو کەسانەی کە ڕاستگۆن بە ئاسانی درۆ دەناسنەوە و بە قورسیش باوەڕ بە درۆ دەکەن**

.............................

**Don't worry about what's in Jannah, but worry how to get there**

**نیگەرانی ئەوە مەبە چی هەیە لە بەهەشتدا ، بەڵکو نیگەرانی ئەوەبە چۆن بگەیت بەوێ**

.............................

**Life is not guaranteed at all but death is absolutely guaranteed upon all, yet we still prepare for life more than death**

**ژیان بە هیچ جۆرێك دەستەبەر نەکراوە ، بەڵام مەرگ لە سەدا سەد دەستەبەر کراوە کە دێت بەسەرماندا**
**کەچی هێشتا ئێمە ئامادەکاری دەکەین بۆ ژیان زیاتر لە مردن**

**We love ourselves even after we make so many mistakes, so why do we hate Others for one or two mistakes they've made**

**ئێمە خۆمان خۆشدەوێ تەنانەت دوای کردنی زۆرتری هەڵەیش ، کەواتە بۆچی ڕقمان لە کەسانی تر دەبێتەوە کە تەنها بۆ یەك یان دوو هەڵە کە کردوویانە**

............................

**Loving your children does not mean you allow them to do as they please Instead, show true love by guiding them to what is best for them**

**خۆشویستنی منداڵەکانت واتای ئەوە نییە ڕێگەیان بدەیت هەرچیان پێخۆش بێ بیکەن، بەڵکو خۆشەویستی ڕاستەقینەیان پیشان بدە بە ڕێنموونی کردنیان بۆ چی باشترینە بۆیان**

بابەتی ژمارە
یەك

سوپاس بۆ خودا
بەسەرکەوتووی ئەم بابەتە گەشتە ئەنجام
**2015-3-8**

